


238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚
Public Figure

لێرە
باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان
بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.
Ganjyna
.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان
drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVslbo_






به ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

# گەشەپێدانی
# کەسێتی



نووسینی: د. عبدالکریم بکار

وەرگێڕانی: شیروان عومەر

نۆرەی چاپ: یەکەم- ٢٠١٩

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەسپاردنی (١١٣١)ی ساڵی (٢٠١٩)ی پێ دراوە.



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA MEDIA CENTER

053 323 1843 | +964 (0) 770 358 7100 www.aramediacenter.com info@aramediacenter.com

بنکەی سەرەکیی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکان: سلێمانی، شەقامی پیرەمێرد، سەروو بەردەرکی سەرا

AraMediaCenter

# پێشەکی



لە ڕاستیدا سوپاسگوزاری خودای گەورەم، کە وا ئێستا هۆشیارییەکی نوێ سەبارەت بە گرنگیی پەروەردە، لە زۆرێک لە وڵاتە موسوڵمانەکاندا سەری هەڵداوە (گەر نەڵێم لە سەرجەمیاندا) بە جۆرێك کە مرۆڤەکان هەست بە بەهای تاك و بەهای ئاراستە و ڕێنموونیکردنی دەکەن.

لەمەش گرنگتر، هۆشیاربوونەوەیە لە ئاست گرنگیی ڕۆشنبیریی پەروەردەیی لە سەرکەوتنی خێزانەکاندا لە ئەرکە پیرۆزە پەروەردەییەکانیاندا، چونکە بۆ زۆرێکمان دەرکەوتووە پەروەردەکردنی منداڵان بە هەمان ئەو شێوازەی کە خۆمانی لەسەر پەروەردە کراوین، کەموکورت و ڕەنگە زیانبەخشیش بێت و ئەم هۆشیار بوونەوەیەش مایەی خۆشحاڵی و ئاسوودەییە.

بێگومان گۆڕانکارییە جیهانییە خێراکان، بەئاگابوون دەکەن بە مەرج بەسەرماندا و وامان لێ دەکەن تەواو بەئاگا بین، تا بەهۆی باش تێنەگەیشتنمان لە ڕۆڵی پەروەردەیمان نەبێتە هۆی لەدەستدانی نەوەکانمان.

دەبینـین منـداڵ و گەنـج و لاو لە ڕێـگەی دەسـتدانان بە چەنـد دوگمەیەکدا یا داگرتنی چەند دوگمەیەك، دەتوانێت بە سەرانسـەری جیهاندا بگەڕێت و ئەمەش دەبێتە هۆکاری:

- تێکەڵبوونی نموونە و وێنەکان لە هزریدا و دەبێـتە هۆکـاری بە کەم بینینی و بە سووك دانانی ئەو دابونەریتانەی لە ژینگەکەیدا باون.
- هاتنەکایەی پشێوی لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ واقیـع، گەر بـاش بـایەخی پـێ نەدەیـن و بەدواداچـوونێکی زۆری بـۆ نەکەیـن پشێوی دێتە کایەوە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ واقیعدا.

د. عبدالکریم بکار



# گەشەپێدانی کەسێتی

پێم وایە لەم سەردەمەماندا بابەتی گەشەپێدانی کەسێتی، لەو بابەتانەیە کە گرنگییەکی تا بڵێی زۆریان هەیە. با لە سەرەتادا بڵێین: کەسێتی لە کۆمەڵێك سیفەتی عەقڵی و هەڵچوونی و جەستیی و کۆمەڵایەتی پێك دێت، کە لە ڕەفتاری کۆمەڵایەتیی تاکدا بەدیار دەکەون و لە کەسانی تری جیا دەکەنەوە.

مرۆڤ لە دیدگا و تێڕوانینی ئیسلامدا، ناوەند و چەقی گەردوونە. گەر بەسەرداچوونەوەیەك بە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و دەقەکانی سونەتدا بکەین، دەبینین پتر لە (٩٠%)یان سەبارەت بە مرۆڤن. چەند ئایەتێکی زۆر کەمیان باس لە چاکسازیی ژینگە و باس لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی دەکەن، بەڵام زۆربەی ئایەتە قورئانییەکان و زۆربەی ئەو هەوڵ و ڕەنجەی کە پێغەمەری خودا (د.خ) لە ژیانی پیرۆزی خۆیدا داویەتی، سەبارەت بە چاکسازیی مرۆڤ بووە، لەبەر ئەوەی گەر ئەم مرۆڤە چاك بوو؛ ئەوا ژیان و ژینگە چاك دەکات، گەر خراپیش بوو؛ ئەوا چەندە بایەخی پێ بدەیت و چەندە توانا و

دەسەڵاتیشـی پـێ ببەخشـێت، هەر خراپـی دەکـات و لەناویشـی دەبات...

خـودای گەورە دەفەرموویـت: "هەرچـی لە ئاسـمانەکان و زەویـدا هەیە، بۆ ئەوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاریی ئێوە فەراهەمی هێنـاوە، هەموویشـی تێکـڕا بەخشش لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاسـتی ئـا لەو بەخشش و دیارییانەدا، بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بـۆ کەسـانێك کە بیر بکەنەوە و تێبفکرن." (الجاثیة: ١٣).

واتە نەك ئەوەی تەنیا لەنێو ئاسمانەکان و زەویـدا هەن، بەڵکـوو چەنـدین ئاسـۆ و مـاوەی دیـارینەکراوی ڕامکـراو هەیە، شـتەکانی دەوروبەرمـان و ئەوانەش کە لە ئـێمەوە دوورن، سـەرجەمیان بـۆ خزمەتکردنی ئێمە ڕام هێنراون، لەبەر ئەوەی ئێمەی مـرۆڤ چەق و ناوەند پێك دەهێنین.

خاڵێکی گرنگ هەیە کە ڕەنگە لە ئاماژەپێدانیدا سوودمەند ببین، ئەویش ئەوەیە عەقڵیەتـی ئەورووپـی -کە لە عەقڵیەتـی ئیغریقـی و ڕۆمانییەوە بۆیان ماوەتەوە- پێی وایە پەیوەندی لە ژیاندا لەنێوان دوو جەمسەردا خۆی دەبینێتەوە :

مـرۆڤ و سروشـت... بەڵام بـوونی بەدیهێـنەر لە تێڕوانینیانـدا، هەبـوونێکی پەراوێـزی و لاوەکیـیە. بە گومـان و ڕای ئەوان، بـوونی خودا تەنیا بۆ هاوکاری و یاوەرییە بۆ وەبەرهێنانی زیـاتری سروشـت و زاڵبـوون و دەستبەسـەرداگرتنی زیـاتری سروشـت. کـاتێکیش نـاوی دەهێـنن، بە شـێوەیەکی شـکۆمەند و پیرۆزڕاگـرتن و پەرسـتراو و

ستایشکراو ناوی ناهێنن، بەڵکوو تەنیا بۆ هاوکاریکردنیان لە سروشـتدا ناوی دەهێنن.

بەڵام لە عەقڵیەتی ئیسلامیدا -بە ڕەچـاوکردنی ئەوەی پێشـتر باسـم کـرد کە مـرۆڤ؛ چەق و ناوەنـدی گەردوونە- بـابەتەکە جیـاوازە و پەیوەندییەکە لەنێوان دوو جەمسەردا دەسووڕێتەوە، ئەوانـیش: خـودای باڵادەسـت و مـرۆڤن. بـوونی سروشـت لە عەقڵیەتـی ئیسـلامیدا، بوونێکی پەراوێز و لاوەکییە، لەبەر ئەوەی ژیـانی دونیـا بە هەمـوو ئەو شتانەی کە تێیدایە -لە تێڕوانینی ئیسـلامیدا- یـان بـریتییە لە لانەی بەڵا و تـاقیکردنەوە، یـاخود مەزرایەکـی دواڕۆژە، یـاخود هەلـێکە بـۆ نزیکبوونەوە لە خودای گەورە و زیاتری نیە.

ڕەنگە ئەمەش یەکێك لە نهێنییەکانی پێشکەوتنی ڕۆژئاوا بێت لە بواری زانست و تەکنەلۆژیا و لە بواری کـاری سروشـتدا، لەبەر ئەوەی وەك باسم کرد؛ سروشت لە عەقڵیەتی ڕۆژئاواییدا شـتێکی جەوهەری پێك دەهێنێت.

بێگومان باوەڕداریی قووڵ، ڕێگە بە مرۆڤ نادات دواکەوتـوو و نەزان و شکسـتخواردوو و بـارگرانی بێـت بەسـەر کەسـانی تـرەوە، چـونکە بـاوەڕداریی ڕاسـتەقینە خـاوەنەکەی تەنیـا بە پێشـکەوتن و سەرکەوتن دەگەیەنێت، باوەڕداریی کەموکـورت و نـاتەواو وا دەکـات میللەتان نەزان و دواکەوتوو بن.

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە:

## بـۆچی بەتـایبەتی گرنگـی بە بـابەتی گەشـەپێدانی کەسـێتی دەدەین؟...

ناکرێت گەشەی مرۆڤ لەسەر ئاستی جەستەیی بەردەوام بێـت، هەروەك چۆن ناکرێت بوونی زۆرێـك لە کەرەسـتە خاوەکـانی وەك کانزاکان بەردەوام بن، لەبەر ئەوەی تەواو دەبن و کۆتاییان پێ دێت، بۆیە مرۆڤیش ناتوانێت تا هەتایە بـژیەت و جەستەشـی هەمیشـە لە باشیدا بێت.

ئەمە لە کاتێکدایە کە گەشەکردن و پێشکەوتن لە بواری ژیری و ڕۆحی و دەروونی و ئاکاری و کۆمەڵایەتی، گەشـەکردنێکی کـراوەیە، هیچ سنوورێك نییە بۆ ڕاگرتنی گەشەکردنمان لە لایەنـی ڕۆحـی و ژیری و کۆمەڵایەتییەوە، هەر بۆیە کاتێك ئێمە بایەخ بە گەشەپێدانی کەسـێتی دەدەیـن، بـایەخ بە کـایەیەکی گەورە و مەزن دەدەیـن کە شایەنی گەشەکردن و نوێگەری و بەردەوامییە تا ڕادەیەك کە خودای گەورە ویستی لەسـەر بێـت... بە تێڕوانینـی مـن، ئەمەش خـاڵێکی گرنگە.

لە لایەکـی تـرەوە گەشـەپێدانی کەسـێتی پێویسـتی بە پـارە و بە تەکنیك و بە ئامێر نابێـت، بـۆیە پـێم وایە ئەم گەشـەپێدانە هەلـێکە لەبەردەم ئەوانەی پارە و سامانیان نییە، وەك هەژاران و نەداران، ئەمە لە کاتێکدا زۆرێك لە گەشەپێدانەکانی تر پێویستیان بە پارە و بە ئامێر و بە هۆ و پێناو و بە ژینگە و پێویستیان بە چەندین شتی هەمەجۆری تر دەبێت.

ئێمە لە قورئانەکەمانەوە و لە فەلسەفەکەمانەوە و لە تێڕوانینمانەوە بۆ ژیان، فێری ئەوە بووین کە باشترین ڕێگە بۆ بەرەنگاربوونەوەی فشارەکانی دەرەوە، بریتییە لە گەشەپێدانی ناخ و ناوەوەمان، و بەهێزکردن و چاکسازیکردن تێیدا.

هەنووکە کۆمەڵگاکەمان ڕووبەڕووی فشارێکی گەورە و مەزن دەبێتەوە و زیاتر و توندتریش دەبێتەوە، ئەم فشارانەش لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و ئاکاری و ڕامیاری و ئابووری و سەربازین...

باشترین ڕێگەش بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەرجەم ئەو فشارانەش، ئەوەیە ئاوڕ لە خۆمان بدەینەوە، ئەمەش خودای گەورە فەرموویەتی: "جا ئەگەر خۆگر و پارێزکار بن، ئەوا پیلان و تەڵەکەی ئەوانە هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێت" (آل عمران: ١٢٠).

بێگومان وتەی "خۆگر و پارێزکار بن" (آل عمران: ١٢٠)، جۆرێکە لە باشترکردنی خود.

هەندێك لە هاوەڵان تووشی شۆك و سەرسوڕمان بوون لەو شکستەی کە لە جەنگی ئوحوددا تووشیان بوو، چونکە ئەمان سەربازی خودان، خودای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: "ئایا کاتێك بەڵا و ناخۆشیەکتان تووش هات (لە جەنگی ئوحوددا) وتتان: ئەمە چی بوو؟ بۆ وامان بەسەر هات؟ لەکوێوە ئەمەمان بۆ هات؟ ئینجا پێیان بڵێ: ئەو بەڵایە لەلایەن خۆتانەوە تووشتان هات، بەڕاستی خودا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە." (آل عمران: ١٦٥).

کە وا بوو ئێمە لە ڕێگەی گەشەپێدانی کەسێتییەوە، باشترین کار دەکەین بۆ بەرگریکردن لەو فشارانەی کە لە هەموو لایەکەوە بەرەورووومان دەبنەوە، پێشم وایە ئەو فشارانە بەردەوام لە زیادبووندان، چونکە ئاکار و ڕەوشت لەسەر ئاستی جیهاندا ڕووی لە دابەزینە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ مرۆڤایەتی پەنا دەباتە بەر هێز و توندوتیژی لە بەرەنگاربوونەوەی سۆز و بەزەییدا، لەبری پرەنسیپ و بنەماکان، پەنا دەباتە بەر هۆ و هۆکار، وە لەبری ئاکاری قوربانیدان، پەنا دەباتە بەر هەوەس و ئارەزوو!..

باشترین ڕێگەش بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو فشارانە ئەوەیە، پێویستە لەگەڵ خودی خۆماندا ڕاستگۆ و ڕاشکاو و بەهێز بین، تا بەسەر خاڵە کەموکورت و لاوازەکاندا، لە خود و دەروونی خۆماندا بچینەوە.

ڕەنگە زۆرێك لە مرۆڤەکان، سروشتی ئەو گۆڕانکارییانە نەزانن کە ئێستا لە جیهاندا ڕوودەدەن، سەد ساڵ یاخود کەمتر لە سەد ساڵ پێش ئێستا، کەرەستە خاوەکان -وەك کانزاکان و نەوت- سەرمایەی سەرەکیی وڵاتانی پێك دەهێنا.

بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیی مەزنەوە، ئێستا گۆڕانکاریی زۆر گەورە ڕوو دەدات، ئەو گۆڕانکارییەش بەو ئاڕاستەیەدا دەڕوات کە ببێتە سەرمایەیەکی نوێ بۆ تاك و کۆمەڵ و وڵات و گەل و نەتەوەکان. ئەوەی نەتەوەکان هەیانە لە ئاکار و پاڵنەر و ئامانج و سیستم و تەکنەلۆژیا و چەمك و بیرۆکە و توانای دەستبەسەرداگرتنی خود و

توانای دۆزینەوەی کایەی نوێ بۆ تێگەیشتن و پیادەکردن. بەردەوام کەرەستە خاوەکان پێگە و بەهای خۆیان دەبێت، بەڵام هەرگیز بەها سەرەکییەکەی جارانیان نابێت.

زۆربەی خەڵکی هەست بەو گۆڕانکارییانە ناکەن کە لە سەرمایەدا ڕووی داوە، بەڵام کاتێك هەستی پێ دەکەن، ئەوکات زیانەکانیان زۆر دەبێت.

هاوشێوەی ئەو کەسەی چەند تەنێك دراوی هەبێت و لەپڕێکدا پێی بوترێت: "ئەو دراوانە پووچەڵ بوونەتەوە و بەکار نایەن، یاخود تووشی دارمان بووە و یەك لەسەر پەنجای نرخی ئێستای دەکاتەوە..."، دەستبەجێ سامانەکەی؛ (٥٠ جار) کەم دەکات.

ڕاستگۆیانە پێتان دەڵێم: ئەو گۆڕانکارییە گەورەیە هەنووکە ڕوو دەدات، پێویستە لە کاتی گونجاودا بەئاگا بێینەوە و وشیار بین و پێش ئەوەی کات بەسەر هەموو ئاست و بوارەکاندا بەسەر بچێت.

بۆ نموونە؛ ژمارەی دانیشتووانی سەنگافورە، نزیکەی سێ ملیۆن کەسە و ڕووبەرەکەی نیوەی ڕووبەری وڵاتی لوبنان دەبێت. ئەم وڵاتە لە سەرەتای شەش مانگیساڵی (١٩٩٦)دا بە بەهای ٣٦ ملیار دۆلار نەوتی هەناردە کردووە، کە هاوتای هەناردەکردنی چوار یاخود پێنج وڵاتی سی و چل ملیۆنییە لەو وڵاتانەی کە نەوتیان نییە.

داهاتی تاك لەوێ لە ١٢ هەزار دۆلار تێپەڕ دەکات، ئەوان شوێن شك نابەن تا تێیدا نیشتەجێ ببن، دەریا پڕ دەکەنەوە و دایدەپۆشن تا

ماڵ و لانە دروست بکەن، لەبەر ئەوەی پارچە زەوییەکی بەرتەسکە، بەڵام ئاگاداری سەرمایەکەیانن.

ئیسرائیل پشت بە سەرمایەیەکی نوێ دەبەستێت، سەرمایەی تەکنەلۆژیا. لە ساڵی (٢٠٠٣)دا بە بەهای چوار ملیار دۆلار چەکی هەناردە کردووە.

وڵاتانی عەرەبیش چەك هاوردە دەکەن و ئەوانیش هەناردەی دەکەن. لەگەڵ زانینی ئەوەی ٤ ملیار دۆلار هێندەی بودجەی ژمارەیەك لە وڵاتە ئەفریقییەکان دادەنرێت، داهاتی ساڵانەی تاك لە ئیسرائیلدا؛ نزیکەی ١٨ هەزار دۆلارە، ئەمەش لە داهاتی وڵاتە ئەوروپییەکانەوە نزیکە. لە (ئیسرائیل)دا هیچ سەرچاوەیەکی داهات نییە؛ نە نەوت، نە کانزا، نە پارچە زەوییەکی بەرفراوان، نە ئاو، بەڵام وەبەرهێنانێکی مەزنی تەکنەلۆژیای هەیە و لەسەر ئاستی جیهاندا یەکەم وڵاتە لە پاراستنی زانیارییەکاندا و لە هەریەکە لە یابان و ئەمەریکا و کەنەدا و وڵاتانی تر پێشکەوتووترە، لەبەر ئەوەی وەبەرهێنانێکی چڕی سەرمایەگوزاریی نوێیان هەیە.

پێویستە ئاگادار بین پێش ئەوەی تووشی شۆك و سەرسوڕمان ببین و بڵێین: کاروان بەجێی هێشتین!، ئەم کارەش ئەرکی بیرمەندان و زانایانە، ئەرکیشیان ئەوە نییە لە کاتی ڕوودانی کارەساتدا گلەیی و گازندە لە بەختیان بکەن، بێگومان هەمیشە ئەرکیان ئەوەیە ڕێگە ڕۆشن بکەنەوە، سەرنجی داهاتوو و ئاسۆی دوور بدەن، وە خەڵکیش لەو مەترسییانە ئاگادار بکەنەوە کە چاوەڕوانیان دەکات.

پێویسته هەستێکی قووڵمان هەبێت سەبارەت بەوەی کە ئێستا هیچ جیاکەرەوەیەك لەنێوان پێشکەوتنی ئاکاری و پێشکەوتنی ماددیدا نییە، واتە: نەتەوەکەمان ناتوانێت لە لایەنی ئاکاری و پەروەردەیی و فێرکاری و ڕامیاری... پێش بکەوێت، بێ ئەوەی لە لایەنی ماددییەوە پێش نەکەوێت.

ئەو کەسانەی چاو لە دەستی کەسانیترن، ناتوانن خوێندنگەیەکی نایاب بدۆزنەوە، لەبەر ئەوەی ئێستا هەموو شتێك پێویستی بە پارەیە، پارەش پێویستی بە گەشەکردنێکی ڕاستەقینەیە، گەشەکردنی ڕاستەقینەش پێویستی بە مرۆڤی پێشکەوتووە، مرۆڤێك کە گەشەی بە خودی خۆی و گەشەی بە بوون و گەشەی بە سۆز و گەشەی بە ئاکار و گەشەی بە لایەنی کۆمەڵایەتی و گەشەی بە ژیری خۆی دابێت، هەڵسوکەوت و ڕەفتاری لەسەر مەبەست ڕەزامەندی خودای گەورە ڕێك خستبێت.

گەر ئەو مرۆڤە نەتوانێت پێش بکەوێت، ئەوا ناتوانین گەشەپێدانێکی باش بدۆزینەوە، کە بە هۆکارێکی سەرەکی دادەنرێت سەبارەت بە پێشکەوتن لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا.

گەر مرۆڤ گۆڕا، ئەوا خودای گەورە ژینگەکەی بۆ دەگۆڕێت، هاوکاری دەبێت و سەرکەوتووی دەکات، گەر لەو توانایانەشی کە لەبەردەستیدا هەن؛ زیادەڕەوی بکات، ئەوا خودای گەورە بە هەمان شێوە شتەکانی بۆ دەگۆڕێت: "بێگومان خودای گەورە بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت (لە خۆشییەوە بۆ ناخۆشی، یان لە

زەلیلییەوە بۆ سەربەرزی، یان لە گـرانییەوە بۆخۆشـگوزەرانی، تـا ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەکرێت، نەیگۆڕن و نەیکەن." (الرعد: ١١).

گۆڕانکـارییەکەش لە دوو ئاڕاسـتەدایە: گەر گۆڕانەکەمـان بەرەو باشـتربوون بـوو؛ ئەوا خـودای گەورە شـتەکانمان بـۆ دەگۆڕێـت و هاوکـاریی نـوێمان پـێ دەبەخشـێت، بەڵام گەر گۆڕانەکەمـان بەرەو خـراپتر بـوون؛ بـوو ئەوا خـودای گەورە بە هەمـان شـێوە بۆمـان دەگۆڕێت.

هیچ خزمـایەتییەکیش لەنێـوان خـودای گەورە و مرۆڤەکانـدا نیـیە، لەبەر ئەوەی یاسا و ڕێساکانی خـودای گەورە بـۆ هەمـووانە و بەسـەر هەموانیشـدا جێبەجـێ دەکرێـت و جیاکـاری و هەڵاوێـردنیش بـۆ هیچکەسێك نییە.



# مەرجەکانی گەشەپێدانی کەسێتی

هەندێك مەرجی سەرەکی هەن، بۆ ئەوەی گەشەپێدان لە کەسێتیدا ڕوو بدات:

## مەرجی یەکەم: بڕوابوون بە گرنگی گۆڕانکارییەکە

ڕەنگە یەکێکمان وا دابنێت مرۆڤێکی باشە، چاکەکارە، لە فلان و فیسارە کەس باشترە و بەپێی توانای خۆی باشترین کاری ئەنجام داوە، پێشی وایە ئەم وتانەی کە دەیڵێم، بەسەر ئەودا ناچەسپێت، هەر بۆیە کاتێك باسی بابەتی گەشەپێدانی کەسێتی، یاخود گۆڕانکاریی خودیی بۆ بکەیت، بە بیریدا نایەت کە ئەم وتەیە -بە وتەیەکی مەترسیدار و گرنگ بۆ خۆی وەربگرێت- بەڵکوو لە باشترین دۆخدا وا وەریدەگرێت کە تەنیا وتەیەکی باش بێت.

بەشێکی تری خەڵك هەن کێشەکەیان جیاوازە، پێی وایە هیچ هیوایەك لە چاکسازیدا نییە و دەڵێت: "گەشە بە چی بدەم؟" ئەو نائومێد و بێزارە لە هەر ئەگەرێکی چاکسازیکردن، بە کەسانێکی زۆر لەم شێوازە گەیشتووم، هەندێکیان پزیشك و مامۆستای زانکۆن، یەکێکیان چاوەڕوانی هاتنی محەمەدی مەهدی دەکات تا لەگەڵیدا دەربچێ، یەکێکی تر چاوەڕوانی هاتنی ڕۆژی دواییە، یەکێکی تر

چاوەڕوانی ئەوەیە خودای گەورە سەرکردەیەکی وەکوو سەلاحەدینی ئەیوبی بۆ نەتەوە بنێرێت، تا دەستی بگرێت و دۆخەکە چاك بکات. یەکێکی تر دەڵێت: "ئێمە لە سەردەمی کۆتاییدایین بۆیە لە مرۆڤ دوور بکەوەرەوە و لە ماڵی خۆت دابنیشە و بەپێی توانا کاروبارەکانت ڕێك بخە."

هەموو ئەم کەسانە هەڵەن، چونکە ئەمە تێگەیشتنی ئیسلام نیە بۆ ژیان.

هەمیشە دەڵێم: هەر بۆچوونێك خەڵك بەرەو ڕێگەیەکی داخراو بەرێت، بۆچوونێکی هەڵەیە؛ هەر بۆچوونێکیش خەڵکی تەمبەڵ و سڕ بکات؛ بۆچوونێکی هەڵەیە، لەبەر ئەوەی پێمان وایە توانای باشبوون و پێشکەوتن و ئەنجامدانی هەر شتێك هەیە و ئەو توانایانەش بەردەوام هەن.

ڕەنگە هەندێك جار نەزانین هەرچەندە کارەکان ئاڵۆزتر بن، هێندە جێگرەوەکان زیاتر دەبن لامان، بەپێچەوانەی خەیاڵبینیی خەڵکەوە، کە زۆرێکیان پێیان وایە گەر کارەکان ئاڵۆز بوون؛ ڕێگەکان دادەخرێن و هەلەکانیش کەم دەبنەوە، ئەمەش هیچ ڕاست نییە و بابەتەکە تەواو جیاوازە، کە چەند کارەکان ئاڵۆز بن؛ بژاردەکان زیاتر دەبن و نیانی و گونجاندمان لە کار و جووڵەدا زیاتر دەبێت.

لە دروستکردنی بۆنی خۆشدا (عەتر)، پەنجا یاخود شەست توخمی کیمیایی بەشدار دەبێت، وە هەر زیادبوون یاخود کەمبوونێك لە هەر توخمێك لەو پێکهاتە فراوانەی توخمانەدا؛ بۆنێکی نوێت پێ

دەبەخشێت، لە کاتێکدا توانـای هەمەجۆربـوون زۆر کەم دەبێـت؛ گەر بۆنێکی خۆشمان هەبێت تەنیا لە دوو توخمی کیمیایی پێـك هاتبێـت، بەڵام توانـایەکی گەورە و مەزنمـان دەبێـت؛ گەر بـۆنێکی خۆشـمان هەبێت لە پێنج سەد توخم پێك هاتبێت.

کەواتە. سـەردەمەکەمان بەرەو ئـاڵۆزبوونی زیـاتر دەچێـت. بەڵـێ، ئـاڵۆزبوونی زیـاتریش هەلـی نـوێ و جێگـرەوەی نـوێمان پـێ دەبەخشێت، ئەمە ئەو لۆژیکەیە کە پێویستە لێیەوە بـڕوانین و بیـری لـێ بکەینەوە.

## مەرجی دووەم: پەسەندکردنی خود

هەندێك کەس هەن لە خـودای خۆیـان، لە خـودی خۆیـان، لە کەسوکار و مامۆستایانیان تـووڕە و نـاڕازین، هـیچ شـتێکیان بە دڵ نییە، پێیان وایە لە ژیاندا بەشێکی دادگەرییان پێ نەبەخشراوە.

بەهەمان شێوە ئەمەش لە تێڕوانینی ئیسلامدا نیـیە، کە دەبێـت بە خودی خۆم و بەو شێوەیەی کە تێیدام ڕازی بم، ڕەنگە زیرەکییەکەم ناوەند بێت، ڕەنگە خۆگریم کەم بێت، ڕەنگە ڕەفتار و مـامەڵەکردنم لەگەڵ کەسـانی تـردا کەمێـك زبریـی تێـدا بێـت، ڕەنـگە شـێوە و ڕووخسـارێکی جـوانم پـێ نەبەخشـرابێت، ڕەنـگە لە ژینگەیەکـی نەخوێندەواردا گەورە بووبێتم، گرنگیان پێ نەدابێتم، لەگەڵ هەمـوو ئەمانەدا، گەر ویستت گەشە بە کەسێتیت بـدەیت، یـاخود ویسـتت پێش بکەویت، دەبێت بە سەرجەم ئەم شتانە ڕازی بیت.

بە درێژایی مێژوو، زۆربەی چاکخوازە مەزنەکان لەنێو سەرجەم نەتەوەکاندا لە توانای کەم و دیاریکراو و هەبووی وڵاتەکانیانەوە هاتوون، بەڵام ئەوان ئەو توانایانەیان گەورە دەکرد و بەکاریان دەهێنا و بونیادیان لەسەر دادەنا.

کەواتە دەبێت بە خودی خۆم ڕازی بم هەرچۆنێکە، هیچ جێگرەوەیەکی تر لەنێوان خودی خۆم و خودێکی تردا نییە، هیچ جێگرەوەیەکی تر لەنێوان نەتەوەکەی خۆم و نەتەوەیەکی تردا نییە، من لەم نەتەوەیەم و دەبێت بە دۆخەکانی ڕازی بم کە ڕەنگە سەختیش بێت، دەبێت لەوێوە دەربچم و لە سایەی ئەو دۆخانەوە بەپێی توانا کار بکەم.

## مەرجی سێیەم: ویستێکی بەهێز و پتەو

گۆڕانکاریی ڕاستەقینە لە ژیانماندا؛ جا ئەگەر دەوڵەت یاخود تاك یاخود کۆمەڵ بین، پێویستی بە دوو خاڵی سەرەکی هەیە:

**خاڵی یەکەم:** تێگەیشتنێکی قووڵ لەو مەرجانەی ئەو سەردەمەی کە تێیدا دەژیت، دەیسەپێنێت. لەنێو خەڵکدا پەندێکی باو هەیە دەڵێت: "دەبێت پابەندی مەرجەکانی یارییەکە بیت." کاتێك یارییەکی بەکۆمەڵ ئەنجام دەدەیت، لێت ڕازی نابن بڵێیت: "فلان یاسام بەدڵ نییە"، جا یان پابەندی یاسای یارییەکە دەبیت، یان یاری ناکەیت، ناشبێت هەر یاریزانێك بەپێی حەز و ئارەزووی خۆی، مەرجێك یان یاسایەك بۆ یارییەکە دابنێ...

هەر بۆیە پێویستە بەقووڵی لە مەرجەکانی لێهاتوویی و مەرجەکانی ژیان لەم سەردەمە و مەرجەکانی بەخشین و هێز و پێشکەوتن... تێبگەین و پێویستە پابەندی ئەو مەرجانە ببین.

هەمیشە پەراوێزێك بۆ فێڵکردن هەیە، بەڵام دیاریکراوە، هەر بۆ نموونە؛ هەندێك موسوڵمان هەن لە ئەمەریکا و ئەورووپا و کەنەدا و ئوستوراليا دەژین، لەوە تێناگەن. دەیانەوێت چێژ لە خێر و خێراتی ئەو وڵاتانە و بیمەی کۆمەڵایەتی و خۆشگوزەرانی... وەربگرن، بەڵام نایانەوێت باج بدەن، نایانەوێت لە مامەڵەکانیاندا ڕاستگۆ بن، ئەوان بیمەی کۆمەڵایەتی وەردەگرن و لەبەردەم حکومەتیشدا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە وا کار نەکەن. هەرگیز ئەم ڕەفتارە ڕاست نییە!

گەر بمانەوێت لە مرۆڤێکی پەراوێز و لاوەکییەوە ببینە مرۆڤێکی ناوەند و سەرەکی، ئەوا پێویستە پابەندی مەرجەکانی ژیانی ئەم سەردەمە ببین.

**خاڵی دووەم:** بریتییە لە ویستێکی بەهێز و پتەو و تێکۆشەر لەپێناو خودای گەورە و ئارامگری و بەردەوامی و بەرەنگاربوونەوەی خود، خودای گەورە دەفەرموێت: "ئەوانەی لەپێناو ئێمەدا و بۆ بەدەستیهێنانی ڕەزامەندیی ئێمە، هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە ڕێنموونی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاك و دروستی خۆمان (کە بەدەستهێنانی

ڕەزامەندیی ئێمەی لەدوایە)، بێگومـان خـودای پەروەردگـار هەمیشـە لەگەڵ چاکەکارانە." (العنكبوت: ٦٩).

بەبێ ویستێکی بەهێز و پتەو، گەشەپێدانی کەسێتی ڕوو نادات، پێشـکەوتنیش لە لایەنـی خـودەوە بـێ بەردەوامبـوون لە هەوڵ و ڕەنجدان ڕوو نادات.

زۆربەی مرۆڤەکـان خەڵات و بەخشـش بەڕێوەیـان دەبـات... دەبینی وتەیەك دەبیستێت، یاخود بەشداریی خولێك دەكات، یاخود وتارێك دەبیستێت، یاخود چاوی بە کەسێك دەکەوێـت، هەنـدێك سۆز و عـاتیفەی لەلا دروسـت دەبێـت، دەهەژێـت و دەکوڵێـت و چەند ڕۆژێکی کەم بەو شێوەیە دەبێت، پاشان وەك دەڵێن: حەلـیمە دەگەڕێتەوە سەر نەریتەکەی جارانی.

گۆڕان و گەشەپێدان و پێشکەوتن...، هەمـوو ئەمـانە پێویسـتیان بە خـۆگری و بەردەوامـی و بە ویسـتی پـتەو و بەهێـز هەیە، وەك ئەو وەرزشـەوانەی کە دەیەوێـت لە یارییەکـدا یەکەم و پێشـەنگ بێـت. دەبینیـت هەنـدێك جـار سـاڵانێکی دوورودرێـژ مەشـق و ڕاهێنـان دەکات، تـا بونیـادێکی جەسـتەیی پـتەوی لەلا دروسـت دەبێـت و تـا لێزانی و کارامەییەکی باشی بـۆ دروسـت دەبێـت، پاشـان ئەو بونیـادە پـتەوە بە مەشـق و ڕاهێنـانی بەردەوام دەپارێزێـت، تـا چرچولـۆچی و خاوبوونەوە ڕوو نەدات.

ئەم وەرزشەوانە، وێـنەیەکمان لە خـۆگری لەسـەر بەردەوامبـوون و خۆگری لەسەر مەشق و ڕاهێنان پێ دەبەخشێت.

هەندێك جار لە مەرجەکانی گەشەپێدانی کەسێتی، بـوونی دۆخـی پێچەوانەیە، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە بە بیروهۆشـی زۆر کەسـدا دێـت، ڕەنـگە هەنـدێکیان پێیـان وا بێـت خۆشـی و خۆشـگوزەرانی؛ کەسێتی دروسـت دەکـات، دەڵـێن: فلانـکەس سـەرکەوتووە، لەبەر ئەوەی کەسـوکارەکەی لە خوێنـدنگەی زۆر باشـدا فێریـان کـردووە. فلان کەس سـەرکەوتووە، لەبەر ئەوەی بـاوکی زانـای... و فلانـکەس سـەرکەوتووە، لەبەر ئەوەی مـووچەیەکی زۆر وەردەگرێـت و تەنیـا لە بەیانیاندا کار دەکات، لە ئێوارانیشدا زانسـت فێـر دەبێـت. ئەم بەڵگـانە هەڵە نین، بەڵام بە درێژایی مێژوو، مرۆڤایەتی لە کاتی تەنگـژە و کێشـە و لە کـاتی کارەسـاتەکاندا پـێش دەکەوت، زیـاتر لەوەی لە کـاتی خۆشی و خۆشگوزەرانیدا پێش دەکەوت، یـاخود لە کـاتی بـارودۆخە گونجاو و لەبارەکاندا. هەندێك لە شارەزایانی گەشـەپێدان ڕاڤەیەکیـان هەیە کە دەریدەخات دواکەوتنی ئەفریقا، هۆکـارەکەی خۆشـگوزەرانی بـووە، ئەمە و پـێش سـەد سـاڵ دانیشـتووانی کەم بـووە، لە هەمـوو شـوێنێکدا کانیـاو و جۆبارەکـان تەقیـون، بەرویـومیش لە دار و درەختەکـان دەکەوتـنە خـوارەوە و کەس نەبـووە کۆیـان بکـاتەوە، کەشوهەواش مامناوەند بووە و پێویستی بە گەڕان بەدوای سـووتەمەنی و گەرمکردنەوە نەبووە.

بەڵام ئەفریقا بەو شێوەیە نەماوە، تووشی بێبـارانی و وشکەسـاڵی بـوو، دانیشـتووانی زۆر بـوو، ئـاوی کەم بـۆوە، مرۆڤەکـانیش لەو گۆڕانکارییـانە تێنەدەگەیشـتن کە بەسـەر ژینگەکەیانـدا هـاتووە، بـۆیە بەردەوام پشتی بە ژینگەیەك دەبەست کە وەك پێشووتر نەمابوو.

ئەمە و هەمان شت بەسەر وڵاتانی تریشدا هاتووە، وڵاتـی ئیسـپانیا لە سـەدەی پـازدەدا لە پیشەسـازیدا لەنێـو وڵاتە ئەورووپییەکانـدا یەکەم بووە، کاتێك هەندێك نـاوچەی ئەمەریکـای باشـووریان داگیـر کـرد، لەوێ هەندێك کانەئاڵتوونیان لێ دۆزییەوە، ڕێژەیەکـی زۆر ئاڵتوونیـان بۆ ئیسپانیا گواسـتەوە، ئیـدی خەڵـك پشـتیان بەو ئـاڵتوونە بەسـت کە دەستیان کەوتووە، چیی دی گەشەکردنی پیشەسـازییان بە سـەرچاوەی پێشکەوتن و مانەوە و بەردەوامبـوون دانەدەنـا، بـۆیە ئیسـپانیا لە ڕووی پیشەسـازییەوە دوا کەوت، تـا لە کۆتـایی وڵاتە ئەورووپییەکانـدا دەبینرێت و تا ئێستاش لە زۆرێك لەو وڵاتانە کەمترە.

دەمەوێت جۆرێك لە بەڕێـوەبردنی نـوێ و هەسـتپێکردن دابهێـنم، لەبەر ئەوەی زۆربەی هەسـتپێکردنەکانی ئەمڕۆمـان تەنیـا بەشـێکی ڕاسـتییەکانی پـێ دەبینـین، ئیـدی بـۆچی کـردەی بەڕێـوەبردنی هەستپێکردنمان ئەنجام نادەین تا ئەو شـتانە ببینـین کە هێـز و توانامـان پـێ دەبەخشـێت و ئەو شـتانەش کە وامـان لـێ دەکەن ئەرێنـی بـین، هەورەها ئەو شتانەش کە ڕێـگەی نـوێی کـارکردن و گەشـەکردنمان لە بەردەمـدا دەکەنەوە؟ لەبـری بەشـە بەتـاڵی پەرداخەکە ببینـین، بـۆچی بەشە پڕەکەی نەبینین؟

کەواتە با وا سەرنجی ڕکابەری و سەختی و گرانییەکـان بـدەین، کە سـەرچاوەیەکی گرنگـی گەشـەپێدان بـن، لەبەر ئەوەی سـەختییەکان وامان لێ دەکەن بەدوای چارەسـەری نـوێ و توانـای نوێـدا بگەڕێـین،

وامان لێ دەکـات گەشـە بە هەنـدێك شـت بـدەین کە پێشـتر وشـك ببوون، یاخود مردوو بوون.

دەبێت هەموومان ئاگامـان لە ناپـاکیی خۆشـی و خۆشـگوزەرانی بێت، یاخود بارودۆخی ئاسان و ژیانی ئاسان ناپـاکیمان لـێ بکـات و وامان لـێ بکـات ئـاوڕ لەو سـەرمایە مەزنە شـاراوانەی نێـو دەروون و ژیری و لە خودی خۆمان و لە پەیوەندییەکانمان نەدەینەوە.



# بنەماکانی گەشەپێدانی کەسێتی

هەندێك بنەمای گەشەپێدانی کەسێتی هەن، پێویستە ئاگاداریان بین و پشتیان پێ ببەستین و لە گەشەپێدانی خۆماندا سوودیان لێ وەربگرین.

**بنەمای یەکەم و گرنگترینیان ئەوەیە، هەمیشە لەدەوری بنەمایەك کۆ ببینەوە.**

کردەی گەشەپێدان: بریتییە لەوەی نەریت و ڕەفتار و ئاکارم بگۆڕم و بەشێك لە خۆشگوزەرانییەکەم داببڕم بۆ ئەنجامدانی کارێك، کە حەزم پێی نییە و دەروونم پێ ئاسوودە نابێت. ئەو کارەش ئاسان نییە، بەڵکوو زۆر سەخت و گرانە.

بێگومان گەورەترین و گرنگترین جەنگێك کە وا مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا بەرپای دەکات، ئەو جەنگەیە کە بە هۆیەوە هەندێك نەریت و ڕەفتارەکانی خۆی بگۆڕێت.

ڕەنگە سەرکردەیەکی سەبازی ببینی ڕابەرایەتیی جەنگێکی گەورە بکات و تێیدا ڕووبەڕووی سوپایەکی گەورە و زەبەلاحی دوژمن

ببێتەوە و گرنگییان پێ نەدات و بە هیچیشیان نەزانێت. ڕەنگە ببینی خودی خۆی دەستەوەستان بێت لە گۆڕینی نەریتێکی بچووکی خراپی خۆی، یاخود گۆڕینی نەریتێکی بچووکی خراپی لای منداڵەکانی، یاخود لای یەکێك لە خوشك و براکانی! هەر بۆیە پێویستە مەبەست لە گۆڕان؛ نزیکبوونەوە بێت لە خودای گەورە، واتە -پێویستە گەشە بە دەروونی خۆمان بدەین- جا ئەگەر لە فێربوون و وەرگرتنی شتی نوێ بێت، یاخود لە ڕزگاربوون و خۆقوتارکردن بێت لە شتی خراپ.

بێگومان گۆڕان بەرەو باشتر، نزیکبوونەوەیە لە خودای گەورە و پەرستشکردن بۆی، لەو بنچینەیەوە دەست پێ بکەین کە ماڵی دونیا کاتییە و ماڵی بەڵا و تاقیکردنەوەیە و مەزرایەکی دواڕۆژە.

یەکێك دەڵێت: "سوپاس بۆ خودای گەورە، من ناوازە و تایبەتم، زۆربەی مرۆڤەکان نازانن ڕەفتار بکەن وەك من، من تەواو پابەندی بنەما و بیروباوەڕەکانی خۆمم و بەتەواوەتی سەرجەم بەرژەوەندی و ئاواتەکانم بەدی دەهێنم. " پێویستە ئاگاداری ئەوە بین ئەگەر هەر یەکێك لە ئێمە ویستی تەواو پابەندی ئەو بنەما و بیروباوەڕانە بێت کە بڕوای پێیەتی و تا ئەوپەڕی بەرژەوەندییەکانی بەدیی بهێنێت، دەبێت بزانین کە وا ئەم کارە مەحاڵە، لەبەر ئەوەی لە هەر ساتێکدا بێت، ڕووبەڕووی تاقیکردنەوە دەبێتەوە و خۆی لەنێوان دوو بژاردەدا دەبینێتەوە: یان دەستبەرداری هەندێك لە بەرژەوەندییەکانی دەبێت لەپێناو ئەوەی لەسەر ڕێگە ڕاستەکە بمێنێتەوە، یان دەستبەرداری

هەندێك لە بنەما و بیروباوەڕی دەبێت لەپێناو ئەوەی بەرژەوەندی و ئاواتەکانی بێنە دی.

ئێمە لە ناوەندێکی ناتەواودا دەژین، لە ناوەندێکی ناتەواویشدا ناتوانین بە چارەسەری تەواو بگەین، لەم ناوەندەدا چارەسەرەکان ناتەواو دەبن، بۆیە کەسی بەختەوەر و بەهێز و سەرکەوتوو؛ ئەو کەسەیە کە هەندێك لە بەرژەوەندییەکانی بکاتە قوربانیی، لەپێناو ئەوەی لەسەر پابەندبوون بە بنەما و بیروباوەڕەکەی بەردەوام بێت. ئەو کەسەشی لەپێناو بەرژەوەندی خۆیدا بنەما و بیروباوەڕەکەی دەکاتە قوربانی، ئەوا ماوەیەکی کەم سوودمەند دەبێت، بەڵام لە دوورمەودادا زەرەرمەند دەبێت.

شتێکی جوانە لەپێناو بنەما و بیروباوەڕێکدا بژین کە بڕوامان پێیەتی -وەك ئەوەی هەندێك جار دەڵێم: گەر سامانی دونیام بدەنێ، دەستبەرداری بیروباوەڕێکم نابم- ئەمەش شتێکی گرنگە و ئەو مانا سەرەکییەیە کە وا ژیانی مرۆڤ و ژیانی ئاژەڵانی زەبوون لێك جیا دەکاتەوە کە لەپێناو ئالیکدا دەژین.

ئەمەش مانا جیاکەرەوەکەیە -واتە: مانای پابەندبوون بە بنەما و بیروباوەڕ و دەستبەرداربوون لە دەستکەوت لەپێناو ئەوەی مرۆڤ بەوەفا بێت بۆ بەها و ئاکار و باوەڕ و ئەو وێنا جوانانەی کە لەنێو سینەیدا هەڵیگرتوون- ئەوە مانا سەرەکی و بنەڕەتییەکەیە.

**بنەمای دووەم:**

لە بنەماکـانی گەشـەپێدانی کەسـێتی، چڕکـردنەوەی گرنگیـدانە لە بازنەی کاریگەریدا.

زۆر جـار لە کـۆڕ و کۆبوونەوەکانمانـدا کەقسـە دەکەیـن -ئەمەش سەرنجێکی زیرەکانەیە هەندێك لە ئەهلـی زانسـت دەریـانبڕیوە- بـاس لە شـتانێك دەکەیـن کە نامانەوێـت، هەرگیـز بـاس لەوە نـاکەین کە دەمانەوێت، وەك ئەوەی بڵێـین: "ئەمریکییەکـان وایـان لـێ کـردین... ئینگلیز وایـان لـێ کـردین... زایۆنییەکـان وایـان لـێ کـردین... فـلان مامۆسـتا لەو شـتەدا هەڵەی کـرد... فـلان دەسـتدرێژیی کـردە سـەر فلان..."

گەر لەو کەسـە بپرسـین کە ئەم قسـەیە دەکـات: تـۆ دەتوانیـت چ کاریگەرییەکت لەسەر ئەو شتانە هەبێت کە ناتەوێت؟ ئەوا بەدڵنیـاییەوە بێدەنگ دەبوو!

شتێکی جوانە هۆشیاریم هەبێت و هەستێکی ڕەخنەگرانەم هەبێـت بە هۆیەوە لە شتەکان وەکـوو خـۆی تێبگەم، بەڵام هەرگیـز ئەمە هـیچ کێشەیەکت بۆ چارەسەر ناکات، لەبەر ئەوەی کێشـەکانمان چارەسـەر نابن، مەگەر ئەو کاتەی گرنگیپێدانەکانمان لە بازنەی کاریگەربوونماندا چـڕ بکەیـنەوە، بـازنەی کاریگەربوونیشـمان ئەوەیە کە پەیوەسـتە بە خودی خۆمانەوە.

بە دڵنیاییشـەوە ژمـارەیەك بـازنە هەن: گـۆڕینی نەریتێکـی خـراپ لەلام، بە چەقی بـازنەی کـاریگەربوون دادەنرێـت. گـۆڕینی نەریتێـك

لای کوڕەکەم، بـازنەیەکی کەمێـك فـراوانترە، واتە: دوورتـرە لە چەقـی کاریگەربوونەکە، لەبەر ئەوەی ڕەنگە وەڵامم بداتەوە و ڕەنگە وەڵامیشم نەداتەوە.

کاتێك خۆم ڕابسپێرم بەوەی نەریتێـك لای هاوسـێکەم بگـۆڕم، بە هەمان شێوە لە بازنەی کاریگەربوون دوورتر دەبێت.

گۆڕینی نەریتێك لای موسوڵمانێك لە ئەندەنوسـیا، شـتێکی زۆر دوورە، بەڵام لە سـنووری توانـای ژێریـدا دەمێنێـتەوە. بەڵام گـۆڕینی شتێك پێش پێنج سەد ساڵ ڕووی دابێت، ئەوە لە سنووری مەحاڵدایە، لەبەر ئەوەی ڕووی داوە و کۆتایی هاتووە.

با فێری هونەری قسـەکردن بـین لەوەی خۆمـان دەمانەوێـت، زۆر جار لە کەسێکەوە دەبیستم: "فڵانەکەس (خودا عەفوی بکـات) وتـی، فـڵانەکەس خـودا سـەرکەوتووی بکـات وتـی و فـڵانەکەس وتـی و فڵانەکەس وتی..."

بەو کەسـە دەڵـێم: تـۆ خـۆت چـی دەڵێـت؟ ئایـا مـاقووڵە هـیچ قسەیەکت نەبێت و کەسێتیت نەبێت، یاخود ڕایەك، یاخود پێشنیارێکی دیاریکراو، یاخود تێڕوانینێك!

تەنیا گوێمان لێتە دەڵێیت: فـڵانەکەس وای وت و فـڵانەکەس وای وت...

من وای دەبینم لە گرنگترین بـابەت و بنەمـا سـەرەکییەکان ئەوەیە، هەمیشە ببینین و بزانین چەقـی کاریگەربوونمـان لەکـوێیە، بـازنەی کاریگەربوونمان لەکوێیە و کار لەسەر ئەو بازنەیە بکەین.

لە کۆندا دەیانوت: سەختترین دوژمنت، دەروونی خۆتە کە لەنێو سنگدایە. ڕاستیشیان فەرمووە، لەبەر ئەوەی ئەو مرۆڤەی دەستەوەسان دەبێت و ناتوانێت هەندێك شت لە خۆیدا بگۆڕێت، ئەوا ناشتوانێت لە کەسانی تردا بیگۆڕێت، چونکە ڕەنگە خەڵك وەڵامت نەدەنەوە، وەك تۆ چۆن وەڵامی دەروون و خودی خۆت دەدەیتەوە.

**بنەمای سێیەم:**

لە بنەماکانی گەشەپێدانی کەسێتی، پێویستە تا ئاستێك هاوسەنگی بپارێزین، ئێمەی مرۆڤ بە فیترەت و سروشتمان توندڕەوین، ئەوەش ڕواڵەتێکی ڕۆشنبیرانە دەرناکەوێت، ڕەنگە شتێکی جێنی بێت خەڵك نەوە لەدوای نەوە بۆی مابێتەوە. گەر کەسێکمان خۆش ویست، دەبێتە تەوەرەی قسەکانی شەو و ڕۆژمان، وەك ئەوەی خودا کەسی تری دروست نەکردبێت، گەر ڕقیشمان لە کەسێك بوو، ئەوا ئەو کەسە دەبێتە کێشەی دێرینمان.

کەسانێکی زۆر دەناسم کاتێك لە کۆبوونەوەیکدا دادەنیشن، هەر دەبێت باسی فڵانەکەس بکەن کە خراپەی لەبەرامبەر کردوون. گەر دوای ماوەیەکیش ڕێك بکەونەوە، لە دوژمنەوە دەبێتە خۆشەویستیان!

هەندێك کەس بۆ وێنە کاتێك بە بازرگانییەوە سەرقاڵ دەبن، نوێژە فەرزەکان و ئەرك و خێزان و خزم و کەسوکار و هاوڕێیانی و هەموو شتێك لەبیر دەکات، بەڕاستی ئەمە مانای توندڕەوییە.

پێویستە پارێزگاری لە وێنە گشتییەکە بکەین، هەروەك هاوەڵی بەڕێز سەلمانی فارسی (ڕەزای خودای لەسەر بێت) دەڵێت و

پێغەمەریش (د.خ) بڕیاری لەسەر داوە و پێی ڕازی بووە: "خودای پەروەردگار مافی لەسەرتە، بۆیە دەبێت مافی خودا بدەیت، وە دەروونیشت مافی لەسەرتە و دەبێت بیدەیت، وە کەسوکار و خزمانیشت بە هەمان شێوە، بۆیە هەموو خاوەن مافێك دەبێت مافی خۆیان بدەیتێ[١]."

ناشێت و نابێت بە ئیشوکارەوە سەرقاڵ ببین و واز لە کارەکانی تر بهێنین، وەك ئەوەی کەسێك واز لە نوێژەکەی بهێنێت، لەبەر ئەوەی سەرقاڵی خوێندنەوەی چیرۆکێکە، لەبەر ئەوەی نایەوێت جووڵە بکات تا تەواوی نەکات.

با بپرسین: کەی مرۆڤ سەرنجڕاکێش دەبێت؟

مرۆڤ سەرنجڕاکێش نابێت، گەر یەکێك لە تایبەتمەندییەکان، یاخود یەکێك لە جیاکەرەوەکان (خاڵە ئەرێنییەکان)ی تێدا بێت، هیچ مرۆڤێکیش نییە چەند جیاکەرەوەیەك (خاڵی ئەرێنی)ی تێدا نەبێت[٢]، بەڵکوو ئەو کاتە مرۆڤ سەرنجڕاکێش دەبێت، گەر هەموو ئەوانەی تێدا کۆ بووبێتەوە کە لە کەسانی تردا لەبەریەك هەڵوەشابێت، وەك

---

(١) ئیمامی بوخاری، لەکتێبی (الصم)، لە بەشی: (من أقسم علی أخیە)، ئەوەی سوێندی لەسەر براکەی خوارد، ژمارە ١٨٣٢.

(٢) بانگهێشتتان دەکەم بۆ ئەوەی خاڵە جیاکەرەوەکان (خاڵە ئەرێنییەکان) لە خۆماندا بدۆزینەوە، لەبەر ئەوەی هزری مرۆڤ هەمیشە حەز بە دۆزینەوەی نەرێنییەکان دەکات، نەك دۆزینەوەی خاڵە جیاکەرەوەکان (خاڵە ئەرێنیەکان). (عبدالکریم بکار)

ئەو کەسە چەندین سیفەتی جیاکەرەوە (خاڵی ئەرێنی)ی تێدا کۆ بوویتەوە، کە زۆر جار ئەمە حاڵەتێکی دەگمەنە.

ئەم هاوسەنگییە، ئەم گشتگیرە، ئەم گرنگیپێدانە بەرفراوانە. و بەخشینی هەر بابەتێك لەوەی شایەنیەتی لە تێگەیشتن و کارکردن، ئەوە وا لە کەسێك دەکات جێگەی گرنگیپێدان و سەرنجڕاکێش بێت.

بۆئەوەی مرۆڤ پارێزگاری لە وێنە گشتییەکە بکات و هیچ شتێك لەدەست نەدات، پێویستە هەمیشە سەرنجی ئەم دوو خاڵە بدات: ئەرکەکان و ئامانجەکان.

**خاڵی یەکەم:** با سەرنجی ئەو ئەرکانە بدەین کە لەسەرمانە، هەوڵ بدەین بەپێی توانا جێبەجێیان بکەین؛ هەندێك لە ئەرکەکان بۆ جەستەیە، هەندێك بۆ کەسوکارە، هەندێك بۆ هاوسێ و دەورووبەرە و بۆ خزم و خوێشە و بۆ کۆمەڵگەیە بە شێوەیەکی گشتی. ئەمە و لەگەڵ ئەرکە شەرعییە ڕۆژانەکان بۆ خودای پەروەردگار (جل جلاله)، با هەمیشە ئەو ئەرکانەمان لەبیر بێت، تا پارێزگاری لە وێنە تەواو و دروستەکە بکەین.

**خاڵی دووەم:** ئەو ئامانجانە چین، کە من یاخود تۆ یاخود فڵانەکەس دەمانەوێت لە ماوەی پێنج ساڵ یاخود شەش ساڵ یاخود لە ماوەی دە ساڵدا بیانهێنینە دی؟ ئەوەی شایەنی باسە، ئێمە کاتێك زۆر جار یەکتر دەبینین و کۆ دەبینەوە، خەمەکانمان بۆ یەکتر باس دەکەین، بەڵام هەمیشە سکاڵاکانمان لە ئامرازەکان دەبن، وەك ئەوەی دەڵێت: "ئەوە پێویستی بە پارەیە و پارەش نییە، ئەو پێویستی بە کادیر

هەیە و کادێریش نییە، ئەوە پێویستی بە یاسا هەیە و یاساش نییە" پێم وایە ئەوە ڕاست نییە، پێشم وا نیە ئامرازەکان زۆر و بێشومارن و هیچ نەتەوەیەکش نییە سکاڵای لە کەمیی ئامرازەکان نەبێت.

پێم وایە ڕەنگە هۆشیاریی مرۆیی لە خراپیی دۆخەکانەوە سکاڵای داهێنابێت، تا ئەو سکاڵایانە بکەنە هاندەرێك بۆ پێشکەوتن و گەشەپێدان و باشتربوون.

گەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو، ئەوا هیچ خەڵکانی سەردەمێك نابینین لە سەردەمەکانی خۆیان ڕازی بن، بۆیە هەمیشە دەبینین سەرجەم مرۆڤەکان سکاڵا دەکەن:

هەرکەسێك دەبینی، گلەیی و سکاڵا لە سەردەمەکە خۆی
خۆزگە هۆنراوەکەم دەمزانی ئەم دونیایە بۆ کێیە؟

وەك ئەوەی دونیا هیچ هاوەڵ و هاوڕێیەکی نەبێت، هیچ سەرکەوتوویەکی تێدا نەبێت، چونکە وەك وتمان هەمووان سکاڵا دەکەن. بێگومان کێشەکەمان لە ئامرازەکاندا نین، بەڵکوو لە ئامانجەکاندان و لە ئامانجە ستراتیژییەکاندا هەژارین، گەورەترین هەژارییش لە ئامانجە قۆناغییەکاندایە، گەر ئامانجەکانمان ڕوون بوونایە -گەر ئامانجمان هەبووایە و بەڕاستی گرنگیمان پێ بدایە، پێمان وایە دەبێت بەدەستی بهێنین- ئەوا تەنیا بە گواستنەوەی

ئامـــانجەکە بـــۆ ناوەنـــدی ســـەرنجدان و ناوەنـــدی هەســـتکردن و گرنگیپێدان، ئامرازەکانیش ئامادە دەبن.

با بیهێنینە پێشچاوی خۆمان، ئـافرەتێکی نەخوێنـدەوار کـوڕە سـێ ساڵەکەی لێ ون بووە، زۆر بەدوایـدا گەڕا و نەیـدۆزییەوە. گەورەتـرین و گرنگترین ئامانج لە ژیانی ئەو ئـافرەتەدا ئەوە دەبێـت کە منـداڵەکەی بدۆزێتەوە، لەبەر ئەوەی کێشەی دۆزینەوەی ئەو منـداڵە بـۆتە ئامـانجی ئێستای لە ناوەندی هەستکردن و لە ناوەندی هەست و گرنگیداندا.

ئەم دایکە لە ماوەی چەنـد خولەکێکـدا دەیـان کەس بـۆ گەڕان بەدوای منداڵەکەیـــدا ڕادەســـپێرێت، دەیـــان کەســـیش دەبینرێـــت هاوسۆز دەبن لەگەڵیـدا، لەبەر ئەوەی هەمـووان کاتێـك کەسـێکی ســـووتاو و دڵشـــکاو دەبیـــنن هیچـــی لەدەســـت نـــایەت، مەگەر بسووتێت و سۆزدار بێت لەگەڵیدا.

## بنەمای چوارەم:

لە بنەماکانی گەشەپێدانی کەسـێتی: بەڵێنـی بچـووك بە خـۆت بدە و هەوڵ بدە پابەند بیت پێیانەوە.

زۆرێك لە مرۆڤەکان دەڵێن: "حەز دەکەم پێش بکەوم و بگـۆڕێم و خۆم بگۆڕم"، بەڵام کارەکە لەسەر خۆی قورس دەکات، دەیەوێت لە شەو و ڕۆژێکدا ببێتە کەسێکی تر. لە ئەسەرێکدا هاتووە: "ئەوەی پێش گەیشتنی؛ گەشتەکەی بەکۆتا دێنێت، نە گەشتەکەی ئەنجام دا و نە ئاژەڵەکەشی زیندوو هێشتەوە تـا بتوانێـت دوای ئەوە بـڕوات، ئەو

له لەناوچوونەوە نزیکە، گەر ئەو بەزەیی بە ئاژەڵەکەیدا بهاتایەتەوە و لە ڕۆیشتندا ئیسراحەتی پێ بدایە، ئەوا گەشتەکەی پێ دەکرد و بە مەبەستەکەی دەگەیشت[1]."

باشتر وایە بڵێت: "لە سەرەتای ئەم مانگەوە، ڕۆژانە دە خولەك قورئان دەخوێنمەوە، لەسەرەتای ئەم مانگەوە، پێداگر دەبم لەسەر ئەوەی ڕۆژێك لە هەفتەیەکدا؛ چارەکێك پێش بەرەبەیان لەخەو هەستم، لە سەرەتای ئەم مانگەوە هەموو ڕۆژێك بڕێکی دیاریکراو پارە دەبەخشم." ئەو نەریت و شتانەی مرۆڤ لە کەسێکی خراپەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی باش؛ زۆر نین، بە هەمان شێوە ئەو شتانەش کە کەسێك لە مرۆڤێکی باشەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی خراپ؛ زۆر نین، بەڵکوو شتانێکی کەمن، ڕەنگە لە پێنج یاخود شەش یاخود دە نەریت و پابەندبوون تێپەڕ نەکات، کە مرۆڤ لە کەسێکی ئاساییەوە بگۆڕێت بۆ کەسێکی خراپ، یاخود لە کەسێکی ئاساییەوە بۆ کەسێکی باش بگۆڕێت.

کەواتە با بەرە بەرە خۆمان پابەندی هەندێك شتی بچووك و کەم بکەین، گەر خۆشمان بە هەندێك شتەوە پابەند کرد، با وەك خۆی دەقاودەق جێبەجێیان بکەین، لەبەر ئەوەی ئەوە تاکە ڕێگەی بەردەوامبوونە لەسەری.

---

(١) ئیبن حەجەری ئەسقەلان ئەوەی پەسەند کردووە کە فەرموودەکە لەسەر عەبدوڵای کوڕی عەمر وەستاوە، (فتح الباري: ١٨/٢٨٤).

گەر ڕۆژێك لە پابەندبوونەکەدا کەمترەخەمیم کرد، ئەوا دەبێت ڕۆژی دواتر دوو هێندەی بکەم، گەر خۆم پابەند کردبوو کە ڕۆژانە دە خولەك قورئان بخوێنمەوە و ڕۆژێك کەمتەرخەمیم کرد و نەمخوێندەوە، ئەوا دەبێت لە ڕۆژی دواتردا بیست خولەك بخوێنمەوە.

هەر کە پابەندی ئەم یاسایە دەبم، دەبینم بۆتە بەشێك لە کەسێتیم و لە بوونم و دەبینم بێ ئەوەی هەست بکەم، باش بووم.

**بنەمای پێنجەم:**

لە بنەماکانی گەشەپێدانی کەسێتی: چیت پێ دەکرێت، بیکە و چاوەڕوانی باشبوونی بارودۆخەکە مەکە.

هاوڕێیەکم کە شاعیر و ڕۆشنبیرە و هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە، پێی وتم: سەرەتای مانگی ڕەجەب خانەنشین دەکرێم.

پرسیم: دوای خانەنشینبوونت، چی دەکەیت؟

وتی: "پابەندبوونم بە نوێژی جەماعەتەوە کەمە، پشتیوان بە خودا زیاتر پابەند دەبم پێیانەوە، ئێستا گەیشتوومەتە تەمەنی شەست و پێنجساڵی و پێویستە زیاتر بەپێ بڕۆم و وەرزش بکەم... دەبێ زیاتر بەپێ بڕۆم."

دڵنیام خانەنشین دەکرێت و نە ئەمیان دەکات و نە ئەویان.

ئەو کەسەی دەڵێت: "چاوەڕوانی هەلێکی زێڕینم تا سوودی لێ وەربگرم"، ئەوە بە ورە لاوازی دادەنرێت، ئەوەش تەنیا خەیاڵ و دواخستنی کارەکانە و دڵی خۆمانی پێ خۆش دەکەین.

ئەو شتە چییە کە ئێستا پێت دەکرێت، کە وا بوو بیکە. بێگومان هەندێك جار هەل هەڵدەکەوێت، هەندێك جار دۆخێك زیاتر لە دۆخێکی تر هاوکاریت دەکات. کەسێك دەناسم دەیوت: "گەر سامانەکەم بگاتە ملیۆنێك، ئەوا ١٠٠ هەزاری لێ دەبەخشم وەك هاوکارییەك لە بونیاتنانی مزگەوتێك لە وڵاتێکی هەژاردا. پاش چەند ساڵێك پارەکانی بەردەستی گەیشتە ملیۆنێك، شەیتان پێی وت: خۆگر بە، تا دەبێتە دوو ملیۆن. پاش ماوەیەکی تر پارەکانی گەیشتە دوو ملیۆن، شەیتان پێی وت: خۆگر بە تا بڕەکە دەگاتە سێ ئەوەندە! وردە وردە پارەکانی زیادی دەکرد و شەیتانیش هەموو جارێك بۆی دوا دەخست.

ئێمە کێشەمان لە بیرکردنەوەدا هەیە، زۆربەشمان دەکەوینە هاوکێشەیەکی خراپەوە، هاوکێشەیەکی سواوە کە ئەویش: ئەوەی دەمانەوێت؛ مەحاڵە و ئەوەشی مەحاڵ نییە نامانەوێت.

کاتێك بە پیاوێك کە دەیەوێت جیهان چاك بکات، دەڵێیت: کتێبێك بخوێنەرەوە و کورت و پوختی بکە بۆ فلان و فلان، هەست دەکات گاڵتەی پێ دەکەیت و ڕێز و پلەوپایەی دادەبەزێنیت.

وێنەی ئەو پیاوێکە، ئاواتی ئەوەی هەیە ببێتە جێنشینی موسوڵمانان لەسەر زەویدا، پێی دەڵێیت: پێت چۆنە ببیتە کوێخا و دەمڕاستی گوندەکەمان!

ئاواتەکانمان زۆر گەورەن، ئەوەشی دەمانەوێت مەحاڵە و ئاسان نییە، ئەنجامیش: زۆربەشمان لەو ئەنجامەدا دەژین... مۆڵەتێکی

کراوەیە، ماوەی بیست ساڵ... سی ساڵ... سەدەیەك... دوو سەدە... بەردەوام دەبێت.

هەر کاتێکیش کەسێك کۆچی دوایی کرد، ئەوە و خوێندکارەکانی مۆڵەتەکەیان بۆ دەمێنێتەوە.

دەمەوێت ئێستا دەستبەکار بین لەوەی دەتوانرێت بکرێت و مەحاڵ نییە، ئەمەش هاوکێشە جیاوازەکەیە، ئەمەش هاوکێشە دژەکەیە: گەر ئێستا کارمان لەسەر ئەوە کرد کە مەحاڵ نییە، ئەوەشی کە ئەمڕۆ مەحاڵە، بەیانی مەحاڵ نابێت.

ناتوانین لە ڕێگەی دانیشتن و تەمبەڵی و مۆڵەتی کراوەوە، مەحاڵ ملکەچ بکەین -مەحاڵیش پلەبەندیی هەیە، دەتوانین بەڕاستەوخۆ مەحاڵ ملکەچ بکەین، ڕێك وەك ئەوەی دەیەوێت کونێك بکاتە دیوارەوە. ئەو سەرەتا بەپێی توانای ئامێرەکەی دەستی کونێکی تێ دەکات، پاشان وردە وردە گەورەتر و فراوانتری دەکات. کەسە ژیرەکان بەو شێوەیە کار دەکەن، ئەوەش کارە ڕاست و دروستەکەیە.

هیوادارم بەسەر دەروونی خۆماندا بچینەوە و هەریەکەمان ئەوە ببینێت: ئایا لەبەرامبەر زۆرێك لە شتەکاندا لە مۆڵەتی کراوەدایە، لەبەر ئەوەی ئەوەی دەمانەوێت -وەك پێشتر باسم کرد- مەحاڵە و ئاسان بەدی نایەت و ئەوەشی دەکرێت و بەدی دێت، نامانەوێت!

**بنەمای شەشەم:**

لە بنەماکانی گەشەپێدانی کەسێتی ئەوەیە، لەسەر دواخستنی حەز و ئارەزووەکان ڕابێین، کاتێك کەسێك بڕیاری خوێندنەوە

دەدات، لە کـاتی دەسـتپێکردنی خوێنـدنەوەکەدا چەنـدین حەز و ئارەزووی لەلا دروست دەبێت، زۆربەشمان وەڵامیـان دەدەیـنەوە و بەدەمیەوە دەچین، لەوانەش:

- ماوەی مـانگێکە قسـەم لەگەڵ فڵانەکەسـدا نەکـردووە. زۆربەمـان کتێـبەکە دادەخەیـن و وەڵامـی ئەو ئـارەزووە دەدەیـنەوە، ڕەنـگە ماوەیەکی دوورودرێژ قسـەی لەگەڵـدا بکـات، پاشـان دەگەڕێـتەوە سەر خوێندنەکەی، ڕەنگە هەر نەشگەڕێتەوە.
- فڵانەکەس قەرزاری منە. زۆربەمان کتێـبەکە دادەخەیـن و وەڵامـی ئەو ئارەزووە دەدەیـنەوە، پەیوەنـدیی پێـوە دەکـات، مـاوەیەکی زۆر قسەی لەگەڵدا دەکات.
- پاشان دەگەڕێتەوە سەر خوێندنەکەی، ڕەنگە هەر نەشگەڕێتەوە.
- پێت دەڵێن: خوانەکە ئامادەیە. زۆربەمـان کتێـبەکە دادەخەیـن و دەچـین بـۆ نـان خـواردن. دوای نـانخواردنیش دەڵێـت: خـواردن پێویستی بە چای خواردنەوەیە، یاخود خەوتنە.

ئەو کاتژمێرەی کە دەتوانرا ٣٠ لاپەڕەی تێـدا بخـوێنرێتەوە، بەهەدەر چوو، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی نەمانتوانی حەز و ئارەزووی زۆرمان لە قسەکردن لەگەڵ فڵانەکەس و داواکاری لە فڵانەکەس دوا بخەین.

مرۆڤ چەندە لە پلەوپایەکانی تەواوی، پلەوپایەکانی شارسـتانێتیدا پێش بکەوێت، توانای زیاتر قوربانیدانی بە ئێستای لەپێناو ئاینـدەدا دەبێت.

دەبوو موسوڵمان مەزنترین کەسی ئایندەویست بووایە لە جیهاندا و لە هەندێك کاردا بەو شێوەیەیە.

ئەو موسوڵمانەی ٨٠ ساڵ دەژی، بەردەوام شەست یاخود حەفتا ساڵ بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی لە گەرما و سەرمادا بەخەبەردەبێتەوە، بەچالاکی و بەنارەحەتی و چاوپۆشی دەکات، لەگەڵ دەروونی خۆیدا تێدەگۆشێت، هەوڵ دەدات لە نوێژەکانیدا بەخشوع بێت. ئەو پیاوە -بەڕاستی- پیاوێکی ئایندەویست و مەزنە، هەوڵ دەدات ئێستای بکاتە قوربانی لەپێناو ئایندەدا، بەڵام ئەمە پێویستی بەوەیە بەسەر ژیانماندا بیگشتێنین، نابێت موسوڵمان لە هەندێك کاردا ئایندەویست بێت لە جۆری یەکەم و لە هەندێك کاردا مانای ئاینده و پلاندانان، یاخود چاوەڕێکردن و نە مانای دواخستنی ئارەزووەکان نەزانێت.

هزری ئایندەویستی هزرێکی گشتگیرە، گرنگی بە ئاینده نادەین، تا ئەو کاتەی توانای قوربانیدانمان بە هەندێك لەو شتانەی ئێستامان نەبێت.

**بنەمای حەوتەم:**

لە بنەماکانی گەشەپێدانی کەسێتی، کاریگەرێتییە واتە: هەریەکەمان هەوڵ بدات ئاستێکی زیاتری کاریگەرێتی بەدەست بهێنێت، کاریگەرێتی واتە: توانای بەدەستهێنانی زۆرترین بەرهەمهێنان کە بەدەست بێت بە بەکارهێنانی ئەو سەرچاوانەی لە بەردەستن، بە باشترین شێوازی بەکارهێنان.

دروسـتکردنی ئۆتۆمبێـل لە یابـان؛ ١٧ هەزار کـاتژمێر کـارکردنی دەوێـت، لە ئەورووپـا؛ ٢٧ هەزار کـاتژمێری دەوێـت، لە ئەمریکـاش؛ ٣٢ هەزار کاتژمێر کاری دەوێت.

هەر یەکێــك لەو وڵاتــانە ئۆتۆمبێلیـــان بەرهەم هێنــاوە، بەڵام جیاوازییەکەیان لەنێوان کاریگەرێتییاندایە.

ســوپاس بــۆ خــودا ئــێمە ئۆتۆمبێــل دروســت نــاکەین و لەو بەراوردکــارییەدا نــین، لەبەر ئەوەی ئەگەری ئەوە هەیە پێویســتمان بە ٥٠ هەزار کاتژمێر دەبوو.

کەواتە کــاریگەرێتی لەوەدا خــۆی دەبینێــتەوە، بە کــاتێکی کەم و توانایەکی کەمەوە دەستکەوتێکی گەورە و مەزن ئەنجام بدەین.



# گرنگیی چەمکە بچووکەکان

”

بۆ ئەوەی مرۆڤ کـاریگەر بێـت، پێویسـتە -لەگەڵ بنەمـا و چەمکە گەورەکاندا- بنەمـا و چەمـکە بچووکەکـانی هەبێـت و بەکاری بهێنێت: تەکنیك، هۆکاری، ئامرازی، شێوازی...

ئەوەی جێگەی داخ و پەژارەی منە، ئێمە بە درێژایـی مێـژوو بیـرۆکە و ئـاوات و دیـدگای جوانمـان هەبـوو، بەڵام هەمیشـە پێویسـتمان بە ڕامیـاری و بەرنـامە هەبـووە، کـاریگەرێتی بـێ بەرنامە نابێـت و کـاریگەرێتی بـێ چەمـکە بچووکەکـان، وەك ئەوە وایە چەمکی تەکنیکیی بەڕێکردن بێت... نابێـت، بەڵکـوو ئاوات و خەمەکانمان لە کۆمەڵە شتێك پێـك دێـن بە ئاسـماندا دەفڕن، واتە: تەنیا قسە دەبن.

“

# تێگەیشتن لە پلەبەندیی کارەکان

هەروەها کاریگەرێتی پێویستی بە پلەبەندی هەیە لە کارەکانماندا:

تەمەنم دیاریکراوە، وزەم دیاریکراوە، توانا و دەسەڵاتم دیاریکراوە، سامان و پارەم دیاریکراوە، پەیوەندییەکانم دیاریکراون، من مرۆڤێکی دیاریکراوم... ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە وا ناتوانم هەموو شتێك بکەم، گونجاویش نییە هیچ شتێك نەکەم. کەواتە دەبێت باشترین شتێك کە بکرێ ئەنجام بدەم، ناتوانم باشترین شتێك بکەم تا پلەبەندیی کارەکانم لەلا نەبێت، وەك ئەوەی بڵێم: ئەم کێشەیە دەکرێتە قوربانی لەپێناو کێشەیەکی گرنگتردا، دەستبەرداری ئەم کارە دەبم لەپێناو ئەو کارە پێویستە، دەتوانرێت دوای ساڵێك ئەنجام بدرێت، بەڵام دەبێت ئێستا بەئەنجامی بگەیەنم، لەبەر ئەوەی بەرگەی دواخستن ناگرێت. پزیشکیش وا دەکات، کاتێك کەسێك دێتە لای و چەند نەخۆشییەکی هەیە، لە ڕێگەی شارەزاییەکەوە بەپێی گرنگیی مەترسییەکان، پلانێکی چارەسەرکردن دادەنێت.

بە شێوەیەکی گشتی ئەم کارە لە بواری شارستانی و چاکسازی و- پەروەردەیی و گەشەپێدان و فێرکردن... سەختتر و گرانترە، بەڵام چەندە سەختی و گرانیی هەبێت، هەر دەبێت لە کۆتاییدا پلەبەندیمان هەبێت و لەسەر بنچینەی ئەو پلەبەندییانە ڕەفتار دەکەین و دەجووڵێین.

# قۆستنەوەی ئەو هەلانەی لە بەردەستدان

”

لە مەرجەکانی کاریگەرێتی: قۆستنەوەی ئەو هەلانەی کە لە بەردەستدان، ڕەنگە هەلە گەورەکان تەنیا یەك جار لە ژیاندا هەڵبکەون. یان بە زانایەکی بەڕێز بگەیت، ڕەنگە تەنیا یەك جار لە ژیانت بۆت هەڵبکەوێت. کە هەست بکەیت دوژمنەکەت شڵەژاوە و ئێستا کاتی هێرشکردنە سەر و لەناوبردنیەتی، ڕەنگە ئەمە تەنیا یەك جار لە ژیاندا هەڵبکەوێت. دەتوانیت مامەڵەیەکی بازرگانیی زۆر باش ئەجام بدەیت، ڕەنگە هەموو ڕۆژێك یاخود هەموو مانگێك یاخود هەموو ساڵێك بۆت هەڵنەکەوێت...

هەلەکان لە بەردەستدان و زۆرن، بەڵام لە دەرگای کەس نادەن و لەسەر خۆمانە بەدوای هەلدا بگەڕێین.

“

# دەرگا کراوەکە

ئێمە کەموکورتیی ڕۆشـنبیری و پەروەردەیـیمان هەیە، هەمیشـە ئەو کەموکورتییانە وامان لـێ دەکـات دەرگـا داخراوەکـان ببینـین و دەرگـا کراوەکان نەبینین. هەر دەرگـایەکیش داخـرا، یەکێکـی تـر دەکـرێتەوە، بەڵام زۆربەمان لەبـری دەرگـا کـراوەکە، سـەرقاڵی دەرگـا داخـراوەکە دەبـین، هەتـا ئەو تەنـگەژانەی پێیـدا تێـپەڕ دەبێـت... بێگومـان هەر تەنـگەژەیەك هەلێکـت پـێ دەبەخشـێت، گەر لە شـوێنی ڕاسـتی و دروسـتیدا بیـت، بەڵام گەر لە شـوێنی هەڵەدا بوویـت، ئەوا مـژدەت دەدەمێ نە تەنگەژە و نە هەل نابینیت.

جارێکیـان کەسـێکی زۆر سـەرپێچیکار وتـی: خـودایە چەنـد سەرپێچیم کردیـت و سـزات نەدام! پـاش سـاتێك بیـری کـردەوە و لە دڵی خۆیدا وتی: چەند سزام خوارد و هەستم پێ نەکرد!

ئەو لە بێئاگایی سەرپێچیەکانی، هەست بە سـزا ناکـات، هەسـت بە هەلیش ناکات، ئەو وێڵ و سەرگەردانە لە ژیاندا، نە ئەمە دەبینێـت نە ئەوە.

# گرنگیی کات

بۆ ئەوەی کاریگەر بین، پێویستە گرنگییەکی تایبەتی بە کات بدەین، چونکە کات ژیانە، زیادەڕەوییکردن تێیدا؛ زیادەڕەوییکردنە لە تەمەن و لە ژیاندا. نامەوێت هیچکەسێك لە شەو و ڕۆژەکەیدا لەسەر سیستمێکی وشك بڕوات، بەڵام دەڵێم: با خۆمان پابەندی ئەنجامدانی کاری ڕۆژانە بکەین، با کاتێکیش بۆ خۆشی و ڕابواردن و کاتبەسەربردن دابنێین، چونکە خۆشی و کاتبەسەربردن شتێکی لاوەکی نییە لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵکوو بۆ نوێکردنەوەی ڕۆح و چالاکی دەروونی و نوێگەریی خود زۆر گرنگە، بەڵام هەروەها دەزانم کە کاری ڕۆژانەم هەیە و دەبێت بەئەنجامی بگەیەنم و زۆر بەتوندی پابەندی ببم. زۆر شت مابوون دەتوانرا باسیان لێوە بکەم، بەڵام وەك دەڵێن: بۆ ملوانکە، هێندەت بەسە دەوری گەردنت بگرێت.

**داوا لە خودای گەورە دەکەم، هەموو لایەکمان سەرکەوتوو بکات بۆ هەموو کارێکی خێر و چاکە.**

# پێڕست



# گەشەپێدانی کەسێتی

د. عبدالكريم بكار

ئەم پەرتووکە ڕێبەرییەکی کاریگەرە بۆ گەشەپێدانی کەسێتی و بەخوێندنەوەی دڵنیادەبنەوە لەوەی کە هەرچەندە گەشەپێدانی کەسێتی کارێکی دژوارو سەختە، بەڵام بەجێبەجێکردنی مەرج و بنەماگرنگەکان ئەم کارە پێشبینیکراو و زامن دەبێت، لەم پەرتووکەدا ئەم بابەتانە دەخوێننەوە:

- **مەرجەکانی گەشەپێدانی کەسێتی، کە گرنگترینیان:**
  - بڕوابوون بە گرنگی گۆڕانکاریی
  - پەسەندکردنی خود
  - ویستێکی بەهێزو پتەو
- **بنەماکانی گەشەپێدانی کەسێتی، ئەوانیش:**
  - کۆبوونەوە لەدەوری یەك بنەما
  - چڕکردنەوەی گرنگیپێدان لە بازنەی کاریگەریدا
  - پاراستنی هاوسەنگی
  - بەڵێنی بچووك بە خۆدان و پابەندبوون پێیانەوە
  - چاوەڕوانی باشبوونی بارودۆخەکە و مەکە چیت پێ دەکرێت، بیکە
  - لەسەر دواخستنی حەز و ئارەزووەکان ڕابێن
- **گرنگی چەمکە بچووکەکان، تێگەیشتن لە پلەبەندیی کارەکان، قۆستنەوەی ئەو هەلانەی لە بەردەستدان.**
- **گرنگیی کات**


0-0521-0000-6



9 780052 100002

نرخی (١٥٠٠) دینارە

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA MEDIA CENTER

www.aramediacenter.com

info@aramediacenter.com

facebook.com/ aramediacenter

instagram/ ara_media_center




Scanned with CamScanner